


زنجیرەی چیرۆکی گیانلەبەران لە قورئانی پیرۆزدا بۆ منداڵان

# سولەیمان و مێروولە






هۆنراوە : مەرسوم گەشبین
نیگار : دڵشاد عەلی

تفسیر
هەولێر
١٤٢٥ ك ٢٠٠٤ز

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ :

وَحُشِرَ لِسُلَيْمَٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾
حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟
مَسَٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾
فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ
ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى
بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩﴾ سُورَةُ النَّمْلِ

**واتە: هەرچی سەرباز و لەشکری سولەیمان هەبوو لە پەری و ئادەمیزاد و باڵندەکان کۆکرانەوە و بە ڕێکوپێکی نمایشیان کرد.. هەتا گەیشتنە دۆڵی مێرولە، مێرولە مێچکەیەك (هاواری کرد و) وتی: ئەهای مێرولەینە بچنە ماڵ و کون و کەلەبەرەکانتانەوە، نەوەکو سولەیمان و سەربازانی پێشێلتان بکەن و هەستتان پێ نەکەن.. سولەیمان (کە گوێی لە هاواری مێرولەکە بوو) زەردەخەنە گرتی و پێکەنی بە هاوار و قسەکەی و وتی: پەروەردگارا یارمەتیم بدە تا سوپاس گوزاری ناز و نیعمەتەکانت بم، کە بەسەر من و دایك و باوکما ڕژاندوتە، هەروەها کۆمەکیم بکە تا کارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدەم، کە تۆ پێی ڕازی بیت، بە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆت بمخەرە ریزی بەندە چاکەکانتەوە.**

مێرولە: زیندەوەرێکە بەشێوەی کۆمەڵ دەژیێ، بۆیە مێرولە بە زیندەوەرێکی کۆمەڵایەتی ناسراوە. کۆمەڵی مێرولە لە دوازدە یان سەدان، یان هەزاران، یان ملیۆنەها مێرولە پێك دێت، هەر کۆمەڵەی شاژنێك یان چەند شاژنێکی هەیە، کاری سەرەکی شاژن بریتییە لە هێلکەدانان، زۆربەی مێرولەکانی هەر کۆمەڵێك کاردەکەن، هەمو ئەو مێرولانەی کاردەکەن مێینەن و هێلانە دروست دەکەن و بەدوای خواردن دەگەڕێن و چاودێری بێچوە مێرولەکان دەکەن و جەنگ دەکەن. نێرینەکانیش لەناو هێلانەکانیان لەکاتی دیاریکراودا دەبینرێن، کاریشیان پیتێنی شاژنەکانە، جا دوای پیتێنت راستەوخۆ دەمرن.



مێرولە ( ١٠٠٠٠ ) جۆری هەیە و رەنگی رەش و خۆڵەمێشی و زەرد و سەوز و شین هەیە. قەبارەی بچوك و گەورەی هەیە، گەورەترین قەبارەی (٢,٥)سەنتیمەترە، بچوکترینیشی نزیکەی (١,٠)سەنتیمەترە. زۆربەی مێرولە دەتوانێ شتی لەخۆی قورستر هەڵگرێ.

زنجیرەی چیرۆکی گیانلەبەران لە قورئانی پیرۆز بۆ منداڵان




# سولەیمان و مێروولە


هۆنراوە : مەرسوم گەشبین

نیگـــار : دڵشـــاد علـی



التفسیر

هەولێر/ شەقامی دادگا ت: ٢٢٢١٦٩٥ ـ ٢٢٣٠٩٠٨

tafseeroffice@maktoob.com. - altafseer@hotmail.com





ناوی نامیلکە : سولەیمان و مێرووولە
هۆنراوەی : مەرسوم گەشبین
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر
نیگار و نەخشەسازی: دڵشاد عەلی
ساڵی چاپ : ١٤٢٥ك - ٢٠٠٤ز
نۆرەی چاپ : یەکەم
چاپکردنی : چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر
تیراژ : ٤٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن : ٣٨ ساڵی ٢٠٠٣

له سەردەمێکی دێرین
له دۆڵێ جوان و بەرین
قەشەنگ و سەوز و ڕەنگین
ڕشتە کێوێکی شیرین
یەکێکی بە پێچاوپێچ
بەرز و نزم و خوار و خێچ
ئەوی تریان لە شانی
پڕ بوو لە دار و کانی
درێژ و وێنەی نەبوو
زۆر پان و پەی نەبوو
دارستانێکی چڕ بوو
لەسێو و هەرمێ پڕ بوو



ڕووباریٚ ئاوی هەبوو
زولاڵ، بەرەو خوار دەچوو
بەسەر تاش و بەرد و چەو
بیٚ وچان بە ڕۆژ و شەو
بیٚ ماندووبوون و بیٚ خەو
ویٚنەی سپی و سەوز و کەو
بە تاڤ و مەنگ و هیٚمن
وەکو ئاسمانی بیٚبن
بە هاژەهاژ و بەتاو
تاڤگەی سپی و کەفاو
ئەم دۆڵە دلڕفیٚنە
بیٚ شیٚوە بوو بیٚ ویٚنە

له سوره‌یه‌كی قورئان
به‌ڕوونی كراوه به‌یان
سه‌ربازانی سوله‌یمان
په‌یامبه‌ری ئینس و جان
گیان له‌به‌ران و ئینسان
په‌ڕه‌نده و باڵه‌نده‌كان
له‌شكه‌ر له‌شكه‌ر باڵه‌نده
هه‌م ئاژه‌ڵ و په‌ڕه‌نده

چه‌ندان له‌شكه‌ری مرۆڤ
به‌جه‌رگ و ئازا و بێخۆف
به چه‌ك و جلی یه‌ك ڕه‌نگ
مه‌شقیان پێكرابوو بۆ جه‌نگ
به ڕێك و پێكی و بێده‌نگ
له سه‌ر دۆڵ و كێو و سه‌نگ
له‌و دۆڵ و له‌و ڕووباره
له‌و ئاو و شاخ و داره



به دەستوری پەیامبەر
جن و ئاژەڵ و بەشەر
لەسەر کێوی پان و چۆڵ
پێش ئەوەی بگەنە دۆڵ
لەشکەر لەوێ وەستابوو
لەسەر لوتکەی چیبا بوو
لەسەر ئەو کێوە چۆڵە
لەنزیکی ئەو دۆڵە





مێرووله‌یه‌ك سه‌رباز بوو
بۆ یاسا چاوی باز بوو
له‌سه‌ر دارێكی هه‌رمێ
كێشك چی بوو چاو له‌ڕێ
واجبی له‌ سه‌ر دار بوو
زۆر هۆشیار و بێدار بوو
دۆڵه‌كه‌یان له‌خوار بوو
ئه‌و خواره‌ هه‌مووی شار بوو
شاره‌كه‌یان دیار بوو
هه‌زار هه‌زار هه‌زار بوو
شاری ئه‌م مێروولانه‌
پڕ له‌ خواردن و دانه‌
به‌ ڕێك و پێكی و جوان
له‌ژێر ده‌ستوور و فه‌رمان



لەوێ دەجولانەوە
دەچوونە نێو لانەوە
ئەم کون و ئەم شارانە
خانەی ئەم سەربازانە
وولاتیان بە یاسا بوو
هەر وولاتێک جیا بوو
مەلیکە و ڕەهبەریان بوو
فەرماندە و ئەفسەریان بوو
پۆلیس و کارکەریان بوو
سەرکردە و ئیش کەریان بوو



مێرووله‌یه‌ك نیگابان
ده‌یڕوانییه‌ خوار و بان
له‌سه‌ر لوتكه‌ی ئه‌و كێوه‌
نه‌وه‌ك یه‌كێك له‌ ڕێوه‌
بێت و نزیك بێ لێیان
تێـك بدا ماوه‌ و جێیان
مێرووله‌ی سه‌ر ئه‌و داره‌
لـه‌ دووره‌وه‌ ئه‌م جاره‌
به‌ سه‌رسوڕمان و ڕامان
ده‌یڕوانییه‌ گیانداران
هه‌ر ده‌هات و هه‌ر ده‌هات
هه‌ر كۆتایی نـه‌ده‌هات



کەر کێوی و ئەسپ و حوشتر
پڵنگ و شێر و بەور
ورچ و کورک و کەمتیار
ئەژدیها و تیمساح و مار
گا و مانگا و گامێـش
زەردەواڵە و پەخشە و مێش
ئاسک و মاممزە کێوی
چەقەڵ و سەک و ڕێوی
فریشتە و مەڕ و بزن
زەرافە و شتی مەزن
تاوس و توتی و کۆتر
هودهود و ئەوانی تر
چەندان سوارە و پیادە
لەسەر فیل و سەر جادە







مێرووله مەترسی بوو
کاتێ ئەوە ڕەسی بوو
بە دەنگێکی فرە بەرز
لەسەر دارەوە بۆ ئەرز
وتی: ئەی مێروولەکان
بچنە نێو ماڵەکانتان
دەسا لە بەینتان دەبا
هێزی سولەیمان بە پا
هەستی پێ ناکەن ئەوان
دەکەونە ژێر پێیان



ئەمەی ووت و حەپەسا
کە دی لەشکەر ڕاوەستا
مێـرووولەکە زوو زانی
تێـدەگەن لە زمانی



فەرماندەیەک نورانی
سەری بەرز کرد ڕوانی
لەسەر دار ئەوی بینی
بە ئارامی پێکەنی
وتی: ئەی مێرووولەکە
هیچ خۆت دڵگران مەکە
زمانی تۆ دەزانم
نەبیتان سولەیمانم
لادەدەین ئەی مێرووولە
نزیک نابین لەو دۆڵە
لەشکەر لەشکەر گەڕاوە
دوور کەوتەوە لەو ناوە

پاشان مێرووله‌ی سه‌ر دار
هێدی هێدی هاته‌خوار
له‌لانه و ده‌شت و كۆسار
به‌ بۆن كران ئاگادار
له‌ژێر زه‌وی درا جاڕ
كۆبوونه‌وه‌ به‌ قتار



ئەفسەران یەکە یەکە
گەیشتنە لای مەلیکە
وتیان: پەیامبەری خوا
لەگەڵ خوداوەند دووا
دەستی بەرز کردە ئاسمان
پاڕایەوە لە یەزدان
دەیگوت خودای میهرەبان
داهێنەری گشت جیهان
بمبەخشە تۆ بەخشندەی
دایك و باوکم عەفوکەی



مێرووله‌كان وا وتیان:
مه‌لیكێكی به‌ ئیمان
به‌م هه‌موو هێز و توانا
به‌رامبه‌ر یه‌كتای دانا
سه‌ری خۆی داده‌نه‌وێنێ
گه‌وره‌یی خوا ده‌بینێ
پادشایه‌ك ئاوا بێ
ترسی خوای له‌دڵدا بێ
پیشه‌ی ده‌ستوری خوا بێ
فه‌رمانی خوای له‌لا بێ
سته‌م، بێدادی نابێ
مێـرووله‌ش مافی ده‌بێ



